www.youtube.com/alibapir۱

بەرەو واقیعێکی ئیسلامی بەهێزوپێزتر

لە کوردستاندا

(٢)

چەند ڕێنمویی یەك بۆ

# حاڵەتی ئیسلامی

لە کوردستاندا

بەشی یەکەم

چاکترین گەنیشتنی دین و باشترین ئاشنابوون بە ژین

علی باپیر

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir1

پەرەو واقیعێکی ئیسلامی بەهێزوپێزتر

لەکوردستاندا

(٢)

چەند رێنموویی یەك بۆ

# حاڵەتی ئیسلامی

لە کوردستاندا

بەشی یەکەم

چاکترینگەیشتنی دین و باشتر ئاشنابوون بە ژین مان

علی باپیر

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir۱

# پێشکەش بۆ بە

- هەڵگرانی شیعاری بەرزی پڕڕێز «لا اله الا الله محمد رسول الله» .

- ڕێبوارانی تەنها ڕێبازی ڕاستو بەهێزوپێز«ئیسلام» .

- ئەوانەی دینی خودایان لە ڕووی قورئانو سوننەتەوە وەك خۆی ناسیوەو، قاڵبی گچکە گچکەیان لەبۆچوونی خۆیانو خەڵکی‌یان بۆ هەڵنەتاشیوەو بازنەی برایەتیان هێندە فراوانو بەرینە هەموو ئەهلی ئیسلامی تێدا دەحەوێتەوەو هیچ کەس والێ‌ناکەن بسڵەمێتەوە؛ واتە: بە ئیسلامی‌یە ژیرو خواپەرستو ڕەوشت بەرزو سەربڵندەکان .

□□□□□

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

# پێناسەی ئەم زنجیرەیە

الحمد لله وكفى وصلاته وسلامه على عباده الذين اصطفى، خصوصا محمد وآله الكرام وصحبه الشرفاء .

بێگومان بەرەوپێشبردنی کاری ئیسلامیو بەهێزوپێزکردنی ئەرکی سەرشانی مسوڵمانانەو ئێمەی مسوڵمانی کوردیش لە کوردستاندا بەتایبەتیو لەهەر جێیەکی دیکەشدا کە بۆمان بلوێ بەگشتی ئەو ئەرکو پێویستییەمان لەسەرشانە. شتێکی ڕوونو ئاشکراشە کە شارەزاییو بەرچاو ڕوونی تێروتەواویش لەهەر کارێکدا هەنگاوی یەکەمو مەرجی سەرەکی سەرگرتنو بەئەنجام گەیشتنیەتی، بۆیە منیش وەك مسوڵمانێکی کورد لە کوردستاندا بۆ جێبەجێکردنی بەشێك لە ئەرکی سەرشانم بەپێویستم زانی لەم قۆناغە گرنگو دژوارەدا کە گەلی کوردی مسوڵمانی پێدا تێدەپەڕێ دەستبەکاربم بۆ نووسینی ئەم زنجیرەیە کە خوا پشتیوانبێ نێوەرۆکیشی وەك ناوی دەبێتو، دەبێتە بنەماو بنچینەیەك بۆ زیاترو چاکتر گەشەکردنو بەرەوپێشچوونی کاری ئیسلامیو هاتنەکایەی واقیعێکی ئیسلامی ڕەسەنترو بەهێزوپێزتر لە کوردستاندا . وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەمڕۆ کوردستان بەگشتی بۆتە جێی سەرنجو تێڕوانینو مەڵبەندێکی گرنگو جێی ئەمیەت پێدانی دنیا، بێگومان بەهێزوپێزتربوونی واقیعی ئیسلامی لەوێدا کاریگەرییەکی بەهێزو ڕاستەوخۆی دەبێت بۆسەر جیهانی ئیسلامی بەگشتیو ناوچەکانی دەوروبەر بەتایبەتی .

هەڵبەتە پاش یارمەتی خودای میهرەبانو کاربەجێ ئومێدی زۆریشم بە هەوڵو هیممەتی دڵسۆزانە کە هەرچی زیاتر ئەم زنجیرە باسە دەوڵەمەندترو دامەزراوتر بکەن بەهۆی تێبینیو سەرنجڕاکێشانو پێشنیاری دۆستانەو بنیاتنەرانەیان .

ئیدی دەست لەدەستو بەرەکەت لەخوا .



www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

# پێشەکی

حاڵەتی ئیسلامی کوردستان -مەبەست کوردستانە بەگشتی و بەتایبەت کوردستانی سەر بەعێراق- بەشێکە لە حاڵەتی ئیسلامی گشتی لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامدا و دەنگ و ڕەنگ و سەنگی هەیە.

جا بێگومان حاڵەتی ناوبراو وەك هەر هەوڵێکی تری مرۆڤ، لە کەم و کوڕی و کرچ و کاڵی خاڵی نیەو پێویستی بە کردو کۆشی زۆر دەکات بۆ گەیشتن و کامڵبوونی و پاشان: «بەرگرتنی». جا ئەم چەند خاڵەی لە دووتوێی ئەم ئاڵقەیەدا زۆر بەگوشراوی دەیاننووسم هەنگاوێکن بۆ گەیاندن و کامڵکردنی حاڵەتی موبارەك و پڕپیت و پێزی ئیسلامی کە تاقە جێگای متمانەو ئومێدی جەماوەری موسوڵمانە لە کوردستاندا، بەهیوای ئەوە کە ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی پڕخێروبەرەکەت بێ و بەرهەمدار بێ و حاڵەتی ئیسلامیش لە وڵاتی کوردستان و هەندەرانیش ڕۆژبەڕۆژی زیاتر سەقامگیرو دامەزراوو بەرقەرار بێ. خودای میهرەبانیشمان بەڵێنی داوە: «والذين جاهدوا فينا لنهديهم سبلنا وان الله لمع المحسنين» العنكبوت(٦٩).

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

# چەند تێبینی‌یەکی گرنگ

١- وەك لەپێشەکی‌ی ئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا گوتوومانە: بۆیە باس‌و لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن دەربارەی بزووتنەوەی ئیسلامیمان کردۆتە ئاڵقەی یەکەم، چونکە بزووتنەوە براگەورەو سەرقافڵەو سێبەری حاڵەتی ئیلامی‌یە لە کوردستانداو ساغی‌و نەخۆشیشی ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر هەموو حاڵەتەکە. جائەوە لەم ئاڵقەی دووەمەشدا ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەموو حاڵەتە ئیسلامی‌یەکەی کوردستاندا دەدوێین، دوای ئەوەی لەبارەی سەرقافڵەکەیەوە دواین‌و هەڵمانسەنگاند .

٢- ئەم نامیلکە هەمووی(١٣) خاڵە -هەتا ئێستا جانازانم زیاتر دەکات یاننا !- وە بۆ ئاسانتر خوێندرانەوەو بڵاوکردنەوەی ئەوا جگە لە خاڵی سێزدەم ئەگەرنا هەر دوو خاڵێکمان لێ‌کردۆتە باسێکی سەربەخۆ بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشی یەکەم: خاڵی(١)و(٢): «چاکتر تێگەیشتنی دین‌و باشتر ئاشنابوون بەژین» .

بەشی دووەم: خاڵی(٣)و(٤): «برایەتی قووڵ‌و فراوان‌و ڕێز لەبوون‌و کاری یەکترنان» .

بەشی سی‌یەم: خاڵی(٥)و(٦): «بەجێ‌هێنانی مافی برا لەبەر خواو نەبوونی دوو هەڵوێستی دژبەیەك‌وجیا» .

بەشی چوارەم: خاڵی(٧)و(٨): «پێ‌لە کرچ‌وکاڵی خۆنان‌و دان بەفەزڵ‌وچاکەی یەکتر هێنان» .

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

بەشی پێنجەم: خاڵی(٩)و(١٠): «تاقە دینەمۆی ئیسلام گیانی بەرەنگاربوونەوەو تەنها ڕێی حوکمڕانیشی توانایی‌و دەسەڵاتدار بوونە» .

بەشی شەشەم: خاڵی(١١)و(١٢): «کۆمەڵو تەوژمە ئیسلامی‌یەکان تەواوکەری یەکترن‌و لەهەموو کەس لەیەك نزیکترن» .

بەشی حەوتەم: خاڵی(١٣): «پێکهێنانی کۆڕێکی ڕاوێژی فراوان کەمترین مەرجی برابوون‌و یەکەمین هەنگاوی یەکبوونە» .

٣- پێشینان گوتوویانە: «دۆست ئەوەیە کە دەتگریێنێ ...» جا بەندە کەم‌وزۆر لەم ڕێنموویی‌یانەدا پەنجە لەسەر نەخۆشی‌و کەم‌وکوڕی‌یەکانی حاڵەتی ئیسلامی لە کوردستان دادەنێ‌و بەناچاری ئاماژەش بۆ کۆمەڵو تەوژمەکانی دەکرێ، هیوادارم هیچ کەسێ لێمان لەدڵنەگرێ‌و مەعنای خراپی لێنەداتەوەو ئەنجامێك لەخۆم نەمویستووە لێ‌ی نەگرێ .

٤- لەبەر ئەوەی لەئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا«بزووتنەوەی ئیسلامی‌و قۆناغی نوێ‌ی» تا ڕادەیەکی باش بزووتنەوە وەك گۆشتی سەرچەپەرێ خراوەتە گۆڕێ‌و لەتەتەڵەو بێژینگ دراوە، لەم ئاڵقەیەدا کەمتر ڕووی تێکراوەو زیاتر تەئکید لەسەر«حاڵەتی ئیسلامی» کراوە بەگشتی‌و جاروباریش کۆمەڵو تەوژمەکانی بەتایبەت قسەیان لێ‌کراوە.

□□□□□

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir1

## خاڵی یەکەم: هەوڵدان بۆ چاکتر ناسینی ئیسلام لەسەر بنچینەی قورئان و سوننەت:

بەڵێ، یەکەمین کاری گرنگ کە ئەم حاڵەتە ئیسلامی‌یە دەبێ بە قیادەو قاعیدەوە ئەنجامی‌بدات بریتی‌یە لەچاکترو زیاتر تێگەیشتن لە ئیسلام لەسەر بنچینەی دوو سەرچاوەی ڕوونو بێ‌چەندوچوونی کە قورئانی خوداو سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری پێشەوان(صلی‌اللەعلیەوسلم)، چونکە خودای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی: «قل هذه سبيلي ادعوا الى الله على بصيرة انا ومن اتبعني وسبحان الله وما انا من المشركين» يوسف(١٠٨) . پێغەمبەری پێشەواشمان(صلی‌اللەعلیەوسلم) فەرموویەتی: «من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين ويلهمه رشده» رواه البخاري، جا ئاشکرایە کە ڕێباز(سبیل)ی پێغەمبەرو بەرنامە(دین)ەکەی لە قورئانو سوننەتدا کورت هەڵاتووەو لێکدانەوەو شەرحو تەفسیری زاناو پێشەوایانی ئیسلامیش جگە لە ڕوونکردنەوەی قورئانو سوننەتو هەڵهێنجانو وەرگرتنی چەند حوکمو یاسایەك کە ئەگەر بەڕاشکاویش نەیانگوتبێ بەشێوەیەك لە شێوە زۆرو جۆراوجۆرەکانی دەلالەت دەلالەتیان لەسەریان کردوون، هیچی‌تر نیە.

دەشتوانین لەچەند بڕگەیەکی کورتدا گرنگی‌و پێویستی وەرگرتن‌و ناسینی ئیسلام لەسەر بنچینەی قورئانو سوننەت بخەینەڕوو:

١- دیارە ئامانجی ئەو حاڵەتە ئیسلامی‌یە بووژاندنەوەی ئیسلام‌و هێنانەوە کایەی حوکمی خوایە . وەك گوتیشمان ئیسلام‌و حوکمی خوا لە قورئانو سوننەتدا کورت هەڵاتوون(١)و غەیری ئەوان

(١) ئەگەر یەکێك بپرسێ ئەدی(ئیجماع‌وقیاس‌و عورف...)و باقی سەرچاوەکانی تری(تشريع) چی ؟! لەوەڵامدا دەڵێین: ئەوانەیش هەر

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

سەرچاوەیەكی ترمان نی‌یە كە دینی خوای لێوەربگرین ! ئینجا بەڵگەنەویستیشە كە ئەم حاڵەتە ئیسلامی‌یەمان بەئەندازەی پابەندبوونو بەڕێوەچوونی بەپێی یاساو دەستوورەكانی(دین) شەرعیەتی خوێو ئیسلامی بوونی خۆی دەسەلمێنێو«ئیسلامی‌بوون» بەرلەوەی«ناو»بێ نێوەرۆكەو لەپێش درووشمو شیعاردا ڕەفتاروكرداره .

٢- خراپترین دیاردەو كوشندەترین دەرد كە بەدرێژایی مێژوو دینداران پێیەوە گیرۆدە بوونو بریتی‌بووە لە دیاردەو دەردی«پەرتەوازەیی» . ئەوەندی سەرنجی قورئانیشم داوە لەمەڕ هۆكارو چۆنیەتی پەیدابوونو سەرهەڵدانی پەرتەوازە (التفرقة) دەبینم دوو هۆكاری سەرەكی دەستنیشان دەكات؛ یەكەم، بەهەڵە حاڵی‌بوون؛ دووەم، دڵنەخۆش‌بوون . بۆ وێنە: خودای زانا دەربارەی هۆو چۆنیەتی پەرتەوازەو لێكجیابوونەوەی دیانەكان فەرموویەتی: «ومن الذین قالوا انا نصاری اخذنا میثاقهم فنسوا حظا مما ذكروا به فاغرینا بینهم العداوة والبغضاء الی یوم القیامة وسوف ینبئهم الله بما كانوا یصنعون» المائدة(١٤) .

ئەوەتا بەئاشكرا دەبینین كە هۆكاری پەیدابوونی ڕقوقینو دوژمنایەتی‌و دواتر پەرتەوازەیی‌و جیاجیایی لەنێوان دیانەكاندا ئەوەبووە كەبەشێكیان لە ئایینی خودا فەرامۆش كردووە: «فنسوا حظا مما ذكروابه» ! .

بەڵێ لەكاتێكدا ئەهلی دین هەریەكەیان بەشێكی دینەكەی دەگرێو لایەنو بەشەكانی تری پشت‌گوێ‌دەخات، وایان لێ‌دێ هەركامێكیان بەس خۆی لەسەر هەق دەبینێو غەیری خۆی لەسەر بەتاڵو، دیارە لە حاڵێكی واشدا لەیەك تێناگەنو دابڕدابڕو پەرتەوازەو

= لەقورئانو سوننەت وەرگیراونو وەك بەدرێژی لە كتێبەكانی(اصول الفقه)دا باس‌كراوە .

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir۱

بڵاوەبن و دواتریش دەست دەکەنە دوژمنایەتی کردنی یەکترو شەڕوئاژاوەش :

هەربۆیەش خودای میهرەبانو پەنهانبین زۆر بەتوندی زەنگی خەتەری بۆ ئوممەتی موحەممەد لێداوەو فەرموویەتی: «ان الذین فرقوا دینهم وکانوا شیعا لست منهم في شيء ...» الانعام(١٥٩) .

هەروەها فەرموویەتی: «... ولاتکونوا من المشرکین من الذین فرقوا دینهم وکانوا شیعا کل حزب بما لدیهم فرحون» الروم(٣٢) .

لەم ئایەتانەوە بێپێچوپەنا دەزاندرێ کە بەشبەش کردنی دین بەهۆی تێنەگەیشتن و خراپحاڵیبوونەوە سەردەکێشێ بۆ بێدینی: «ولست منهم في شيء»، وە سەردەکێشێ بۆ هاوبەشپەرستی(الشرك): «ولا تکونوا من المشرکین» !!

وە سەبارەت بەوە کە دڵنەخۆشیش دووەمین هۆکاری جیاجیایی و پەرتەوازەیی کۆمەڵی مسوڵمانە، خودای میهرەبان فەرموویەتی: «کان الناس امة واحدة فبعث الله النبیین مبشرین ومنذرین وانزل معهم الکتاب بالحق لیحکم بین الناس فیما اختلفوا فیه وما اختلف فیه الا الذین اوتوه من بعدما جاءتهم البینات بغیا بینهم ..» البقرة(٢١٣)، لێرەشدا دەبینین کە«بغیا بینهم» کە بەمەعنای حەسەدو زوڵمیش هاتووە کراوەتە هۆکاری بنەڕەتی پەیدابوونی جیاوازی و پەرتەوازەیی نێوان خاوەن کتێبەکان .

جا خوا بەلوتفی خۆی بمانپارێزێ لەهەردوو دەردی«کەمهۆشی»و«دڵنەخۆشی» .

٣- خوای زاناو وردبین لەسەرەتای سوورەتی(ال‌عمران)دا کە باسی هەڵوێستی خەڵکی دەکات لەبەرانبەر ئایەتەکانی قورئاندا دەیانکاتە دووبەش؛ دڵنەخۆشان، ڕۆچووان بەزانیاریدا، وەك دەفەرموێ: «هو الذي انزل علیك الکتاب منه ایات محکمات هن ام الکتاب واخر متشابهات فاما الذین في قلوبهم زیغ فیتبعون ما تشابه

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir1

منه ابتغاء الفتنة وابتغاء تأويله وما يعلم تأويله الا الله والراسخون في العلم يقولون امنا به كل من عند ربنا وما يذكر الا اولوا الباب» ال‌عمران(٧). لەم ئایەتە بەپێزەوە دەزانرێ کە کەسانێکی چاك تێگەیشتوو لە ئیسلام‌و ڕۆچوو نەك سەرکێڵ لە زانیاری بەرنامەی خودا دووچاری دەردی لادان‌و بەش‌بەش‌کردنی ئاین نابن‌و ئیمانیان بەهەموو بەش‌و لایەنەکانی دەبێت‌و دەڵێن: هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە: «کل من عند ربنا ...» !

لەڕاستیشدا ئەگەر سەرنجی ئەوانە بدەین کە دووچاری بەش‌بەش‌کردنی ئاین‌بوون‌و لایەنێکیان یان چەند لایەنێکیان لێ‌گرتووە‌و لایەنەکانی تریان لێ‌فەرامۆش کردووە، دەبینین هەموویان لەم خاڵی هاوبەشی«خراپ‌حاڵی‌بوون»دا یەکیان گرتۆتەوە‌و بەوجۆرە یەکیان دین بەس بە(عەقیدە) تێ‌دەگات‌و ئەوی‌تر بەس پەروەردەوفێرکردن‌و یەکی‌تر بەس بەزوهدو تەصەووف‌و ...هتد .

جا بێگمان تاقە چارەی ئەو دیاردەو دەردەو تەنها ڕێی کۆبوونەوەی مسولمانان‌و ڕیزبوون‌و پێکەوە جۆشدانیان ئەوەیە کە لەبەر تیشکی قورئان‌و سوننەتدا ئیسلام وەربگرین‌و بەو شێوەیەی کە خوداو پێغەمبەری خودا(صلی‌اللەعلیەوسلم) فەرموویانە دینداری بکەین . خودای کاربەجێش لە حاڵەتێکی‌وادا گفت‌و بەڵێنی سەرفرازی‌و سەرکەوتنی پێ‌داوین وەك فەرموویەتی: «ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما» الاحزاب(٧١) .

هەروەها پێغەمبەری خوداش گەورەترین صەلات‌و سەلامی لەسەربێ، کە فەرموویەتی: «لقد تركت فيكم ما ان تمسكتم به لن تضلوا بعدي ابدا؛ كتاب الله وسنتي»، وە هەواڵیشی پێ‌داوین کە تەنیا ئەوانە لەدەردی پەرتەوازەیی‌و جیاجیایی قوتاردەبن لە کاتێکدا کە ئوممەتی دیکەش وەك جوولەکەو دیانەکان دووچاری دەبێ، کەلەسەر خەت‌و ڕێبازی خۆی‌و هاوەڵەکانی دەڕۆن کە دیارە ئەو

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

خەتورێبازەش هەر قورئانو سونندتبووە، وەك دەفەرمووێ: «افترقت اليهود على احدى وسبعين فرقة كلها في النار الا واحدة، وافترقت النصارى على ثنتين وسبعين فرقة كلها في النار الا واحدة، وستفترق امتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار الا واحدة: ما انا عليه واصحابي» .

لەكۆتایی ئەم خاڵەشدا ڕوونكردنەوەیەك بەپێویست دەزانم: ئێمە كەدەڵێین دین بەس لە قورئانو سوننەت وەردەگیرێ، مەبەستمان خوانەخواستە بێڕێزیو كەمحورمەتی پیشاندان نی یە دەربارەی زاناو پێشەوایانو بەرهەمو كەلەپووری ڕەسەنو دەوڵەمەندیان، بەڵكو مەبەستمان ئەوەیە كە(دین)و غەیریوی تێكەڵ نەكەین، ئەگەرنا لەچەندان شوێندا بەنووسینو گوتن تەئكیدمان كردۆتەوە، قسەو بەرهەمی زانایانو كەلەپووری ڕەسەنیان لەهەموو لقەكانی زانیارییەكانی شەرعدا وەك: تەفسیرەكانی قورئانو شەرحەكانی سوننەتو فقهو(أصول الفقه)و (علم الكلام)و تەزكیەو تەسەووفو ...هتد جێی ئەوپەڕی ڕێزو حورمەتو تەقدیرەو چاكترینو گرنگترین هاوكارو یارمەتیدەریشمانن بۆ قووڵترو فراوانترو ئاسانتر تێگەیشتن لە(ئایین)، بەڵام گرنگ ئەوەیە (دین)و(تدین) تێكەڵ نەكەینو خودی ئیسلامو چۆنیەتی تێگەیشتنو حاڵیبوونی ئەموئەو لەئیسلام لەیەك جودابكەینەوە، تاكو بەبەهانەی دەمارگیری(تعصب) بۆ(دین) كەعەینی هەقە، تووشی دەماگیری بۆجۆرێك لەدینداری كردنو تێگەیشتن لەدینیش نەبین، كە دەماگیری یەكەمیان ڕەسەنایەتی دینداریمان دەسەلمێنێو نیدووەمیشان كەللە ئیشكیو ....!

چونكە دەمارگیری بۆ(دین) سەختگیریە لەپابەندی بەهەقی موتڵەقو بێپێچوپەنای خوایییەوە كە جگەلە(باطل) هیچیتری لەئاقاردا نی یە: «فماذا بعد الحق الا الضلال» یونس(٣٢)، بەڵام

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir1

دەمارگیری بۆجۆرێك لەجۆرەكانی لێكدانەوەو تێگەیشتن لە دین سەختگیری یە لەپابەندی بەڕەئی و بۆچوونێكی ئینسانانەوە كەڕەئی و بۆچوونی تری لەبەرانبەردا هەن و پێكانی هەقیش لەسەر هیچ كەس تاپۆ نەكراوە !

ئەمەو سەرەڕای ئەمەش بەبارتەقای ڕووداوەكانی ڕۆژگارو گۆڕانكاری یەكانی كۆمەڵگاكانی مرۆڤایەتی پێویستە دین تەفسیرو لێكدانەوەی نوێی لەسەر بكرێت و كێشەو گیروگرفتە تازە سەرهەڵداوەكانی پێ چارەسەربكرێن، دیارە هەر ئەم ڕووحی نوێبوونەوەو دینامیكیەت و گەشەكردن و مەودای لێكدانەوەو تەفسیری نوێ و تازە دانەی دینیشە كە نایەڵێ دووچاری حاڵەتی وەستان و جموودبێ و، بتوانێ بەئەندازەی سەرهەڵدان و پەیدابوونی كێشەو گرفتە تازەكان یاساو حوكمی نوێ و پڕ بەپێست بەدەستەوە بدات و عومەری كوڕی عەبدولعەزیز گوتەنی: «تجد للناس من الأقضية ما تجد لهم من القضايا»، واتە: یاساو حوكمی نوێ -لەئیسلامدا- بۆ خەڵكی پەیدادەبن بەئەندازەی ئەوەی كە كێشەی نوێیان بۆ دێتە گۆڕێ .

□□□□□

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

## خاڵی دووەم: کۆشش کردن بۆ لەرچی زیاترو چاکتر دەرك کردنو شارەزابوونی واقیعی کۆنو ئێستای کوردستان.

بەڵێ مسوڵمانە بەڕێزەکان؛ ئاشنابوونو شارەزایی هەر خاوەن ئیشوکارێك بەشوێنو زەمینەی کارەکەی مەرجی گرنگی سەرکەوتنیەتی لەو ئیشوکارەیدا. بۆ وێنە: بابای ڕاوچی هەتا چاکتر شارەزاو بەلەدی ئەو شوێنانەبێ کەڕاویان تێدا دەکات چاکتر دەتوانێ زەفەر بەنێچیرەکەی ببات، وە بەپێچەوانەوەش. هەروەها ئینسانی جەنگاوەر ئەگەر شارەزای(شەڕگە) نەبێ ناتوانێ وەك پێویست دەوری خۆی ببینێ. خۆ پزیشکیش کەنەخۆشی دەچێتەلا، ئەگەر بیەوێ وەك پێویست چارەی بکا ئەوا بەر لەهەموو شتێك دەستدەکات بەگەڕانو پشکنین بۆ دۆزینەوەی دەردو نەخۆشی‌یەکەی ئینجا پاشان چارەسەری بۆ دیار دەکات!

مامۆستاش هەتا زیاتر قوتابی‌یەکانی خۆی بناسێو بەئاستی بیروهۆشو چۆنیەتی باری دەروونیو جۆری کەسایەتیان ئاشنابێ چاکتر دەتوانێ ئەوەی مەبەستیەتی لێیان حاڵی‌بکاتو فێریان بکات.

بەڵێ لەدوای تێگەیشتن لەئایین(الفقه في الدين)، شارەزابوونی واقیع(الفقه في الواقع)یش یەکجار گرنگە بۆ ئەوەی ئینسانی مسوڵمانو کۆمەڵی خودا بتوانن وەك پێویست دینداری‌بکەنو ئاینی خوا ڕەنیو بێننو کۆمەڵگا بەپێی هیدایەتی خوا هەڵسوڕێنن. هەربۆیەش پێغەمبەری خودا صەلاتو سەلامی خوای بڕژێتەسەر فەرموویەتی: «من یرد الله به خیرا یفقهه في الدین ویلهمه رشده» متفق علیه، واتە: کەسێك خوا بیەوێ چاکەوخێری بێنێتەڕێ لەئایین شارەزای دەکاتو سەرڕاستیشی فێردەکات.



www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir

جا بەندە وا [illegible] کام لە«شارەزایی لەدین‌دا»و «سەرڕاستی لەژین‌دا»ی تێدان ! چونکە«فقه» لەزاراوەی قورئانو سوننەتدا بۆحاڵەتی تیۆری«نظري» بەکارهاتووەو، (رشد)یش بۆ حاڵەتی عەمەلی، بۆ وێنە خودای کاربەجێ لەسووڕەتی(الانفال)دا دەربارەی هۆی پێنەویرانی بێباوەڕان لەگەڵ زۆری ژمارەشیاندا بەمسوڵمانان، فەرموویەتی: «... بأنهم قوم لا يفقهون» ئایەتی(٦٥)، کەدیارە مەبەستی حاڵی‌نەبوونو تێنەگەیشتنیانە، بەڵام لەسووڕەتی(هود)دا لەسەر زمانی(لووط) عليه السلام ڕوو لەگەلەکەی خۆی دەکاتو بەناسۆرو پەژارەوە پێیان دەڵێ: «...أليس منكم رجل رشيد ؟» ئایەتی(٧٨)، کەدیارە لێرەدا مەبەستی(لووط) سەلامی خوای لەسەربێ پیاوێکی مەردو بەجورئەتو جوامێرە کە هەڵوێستێکی ڕاستو شەریفانەی هەبێ لەو حاڵەتە ناسکو دژوارەدا .

جادیارە هەروەك چۆن بەبێ شارەزایی قووڵو فراوان لەدین‌دا ئینسان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ دین‌دا بەهەڵە دەچێ، بەهەمان شێوەش بەبێ ناسینی چاكو وردی واقیعی ژینو گوزەرانی کۆمەڵگا ئینسان ناتوانێ ڕەفتارو هەڵوێستی ڕاستو درووستو پڕ بەپێویستی هەبێ . واتە هەرچەندە ئینسان لەئایین‌دا شارەزابێو چاكچاك دەرکی قورئانو سوننەتی کردبێ، بەڵام بۆئەوەی بتوانێ حوکمو یاساکانی قورئانو سوننەت لەجێی خۆیاندا بەکاربهێنێو هەرشتە لەشوێنی خۆیدا دابنێ، حەتمەن دەبێ شارەزایی‌یەکی باشی واقیعو حاڵوباڵی ئەو کۆمەڵگایەش‌بێ کە دەیەوێ ئایینی تێدا پیادەبکات، بەڵێ، ئینسانی مسوڵمانو کۆمەڵی مسوڵمان دەبێ هەم(فقیه)بن هەم(رشید)، یانی هەم شارەزابن هەم وەستا، یان هەم زانابن هەم دانا، یان هەم تێگەیشتووبن هەم پێگەیشتوو، یان هەم زانیاربن هەم ئەزموون‌دار، یان هەم بزانن هەم بتوانن، یان هەم حاڵی‌بوونیان هەبێ هەم حاڵ !!

لەڕاستیشدا هەروەك چۆن ئەو کەسەی کە بۆناسینی ئیسلام



www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

قوڕئانو سوننەت ئاگاتە بنچینەی تێگەیشتنەکەیو بەهەڵەدا دەچێ، بەهەمان شێوەش کەسێك لەسەر بنچینەی شارەزایيو ئاشنایەتی هەبوون بەواقیعی کۆمەڵگایەکەی دەستبەکار نەبێ بێگومان هەڵدەخلیسکێو لەڕێگا هەتلە دەبێ، بۆیەش خودای پەروەردگار پێمان دەفەرمووێ: «..واتوا البیوت من ابوابها..» البقرة(١٨٩) .

ئێستاش بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست چەند وێنەیەك دێنینەوە بۆ چۆنیەتی بەهەڵەداچوونو خلیسکانی ئینسان لەناسینی ئیسلامو کاربۆکردنیدا بەهۆی نەشارەزایی لەقوڕئانو سوننەتو ئاناشنایی بە واقیعی کۆمەڵگاکەی:

ئێستا لەسەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا جۆرەها پێرو دەستە هەن کە پێیانوایە ئیسلامەتی بەس زوهدو تەزکیەو لەگەڵ خۆخەریكبوونو زیکروفیکرەوە سەرگەرمبوونەو...هیچیدی !! کە ئەمانە لەنێو خەڵکیدا بە صۆفيو دەروێش یان ئەهلی طەریقەت ناسراون، جا ئایا هۆی بەهەڵەداچوونی ئەم جۆرە مسوڵمانانە کە زۆربەی هەرەزۆریشیان هەر بەڕاستی پێیان وایە ئیسلام بەس ئەوەندەیە کە ئەوان گرتوویانەو مسوڵمانەتیش حەرفێکی لەوە زیاتر نیيە کەکردوویانە، چيیە ؟

بێگومان هۆی بەهەڵەداچوونەکەیان هەر ئەوەیە کەنەهاتوون لەسەر بنچینەی قوڕئانو سوننەت ـکەدین هەر لەمانە داهەیەـ لە ئیسلام تێبگەنو شارەزابن، ئەگەرنا بێگومان هەر بە خوێندنەوەی سووڕەتی(البقرة) حاڵی دەبوون کە:

١ـ «وكذلك جعلناكم امة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ...» (١٤٣) .

٢ـ «ومن حيث خرجت فول وجهك شطر المسجد الحرام...» (١٥٠) .

٣ـ «فاذكروني اذكركم واشكروا لي ولا تكفرون...» )١٥٢) .

٤ـ «ياءيها الذين آمنوا استعينوا بالصبر والصلاة ان الله مع الصابرين» (١٥٣) .

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

٥- «ياءيها الذين آمنوا كلوا من الطيبات ما رزقناكم واشكروا لله...» (١٧٢) .

٦- «ياءيها الذين آمنوا كتب عليكم القصاص في القتلى...» (١٧٨) .

٧- «كتب عليكم اذا حضر احدكم الموت ان ترك خيرا الوصية ...» (١٨٠) .

٨- «ياءيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم ...» (١٨٣) .

٩- «ولا تأكلوا اموالكم بينكم بالباطل وتدلوا بها الى الحكام...» (١٨٨) .

١٠- «وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا...» (١٩٠) .

١١- «وانفقوا في سبيل الله ولا تلقوا بأيديكم الى التهلكة...» (١٩٥) .

١٢- «وأتموا الحج والعمرة لله ...» (١٩٦) .

١٣- «ياءيها الذين آمنوا ادخلوا في السلم كافة ولا تتبعوا خطوات الشيطان...» (٢٠٨) .

هەركام لەم(١٣) فەرمانانەو غەیری ئەوانیش کە هەموو لایەنەکانی تاکی‌و کۆمەڵی‌و ماددی‌و مەعنەوی ژیانیان گرتۆتەوەو هێندەی نووکی دەرزیش بۆشایی‌یان لە ژیانو گوزەرانی ئینساندا بەجێ نەهێشتووە . بەڵێ هەرکام لەم فەرمانانە بەشێکی دینن‌و بەهەمووشیان ئەو ئایین‌و بەرنامەیە پێکدێنن کەخودای کاربەجێ ڕوو بە پێغەمبەرەکەی‌و ئوممەتی فەرموویەتی بۆم تەواوکردوون‌و بۆم هەڵبژاردوون: «اليوم اكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام دينا...» المائدة(٣) .

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir

وەئەوانە هەر بەتۆزە شارەزاییەك دەربارەی سوننەت و سیرەو ژیانی پێغەمبەرەکەیان(صلی‌الله‌علیه‌وسلم) تێدەگەیشتن کە مسوڵمانەتی بریتی‌یە لە مەردی حەرب و میحراب بوونو، پیاوی دوارۆژو دنیابوونو ئەسپ تاودان لەهەردووك مەیدانی سیاسەت و عیبادەت و تەقواو غەزادا، چونکە پێغەمبەر(صلی‌الله‌علیه‌وسلم) هەم ئیمامی مسوڵمانان بووەو هەم سەرکردەیانو، هەروەك چۆن لە شەونوێژاندا پاژنەپێیەکانی قەڵشیوەو ڕیش و بەرۆکی بە فرمێسکان تەڕبووە، لەشەڕو شەبەیخوونانیشدا ددانی شکاونو ڕوومەتی قەڵیشیونو شەلاڵی خوێن بووە !!

بەلام براپانی صوفی و ئەهلی طەریقەت یان هەر نەخوێندەوارو بێئاگان لەدین و دنیا، یان ئەوانەیان کە سەوادێکیشیان هەیە لە جیاتی ئەوەی خەریکی تێگەیشتنی قورئانو سوننەت بن، هەموو کاتی خۆیان بەس بەخوێندنەوەو موتالای کتێب و سەرچاوەکانی(تصوف)ەوە بەسەردەبەن، کە مەگەر چۆن دەنا لەشتی ئەفسانەو پڕوپووچ و بیدعەت خالی نین و بەمجۆرە مێشکی خۆیان پردەکەن لە شتی دژی دین و پووچ و ناماقووڵو بەلای خۆشیانەوە کاکڵەی دین بەس لەلای وانەو خەڵکی‌تر بەس خەریکی توێکڵ و ڕواڵەتە !! وەسەرەنجام دووچاری دەردی کوشندەی نەفامیی ناوێتە(الجهل المرکب) دەبن و نازانن و ناشزانن کە نازانن !!

دیسان لەڕۆژگاری ئێمەدا خەڵکێکی پەڕاگەندەو تاك‌تاك و پێکەوە جۆش‌نەدراو هەیە لەسەرتاسەری دنیای ئیسلامدا کە لەئەنجامی تێنەگەیشتن لەقورئانو سوننەت و ازهێنان بە لەبەرکردنی چەند سورەتێکی قورئانو کۆمەڵە فەرموودەیەکی پێغەمبەر(صلی‌الله‌علیه‌وسلم ) بەبێ پێداقووڵبوونەوەو ڕۆچوونو حالی‌بوونی تەواوەوە گیرۆدەی هەندێك ڕەفتارو هەڵوێستی سەیروسەمەرەو داهێنراو بوون کە لەنێو خەڵکیدا وەك نێوچەوانی گای بەشیان لێ‌هاتووەو پێیانەوە دەناسرێن، بۆ وێنە: هەبوونی کۆمەڵو فەرماندەو بەیعەت بەبیدعەت زانین



www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

لەکاری ئیسلامیدا !! کورت هەڵێنانی ئایین لەهەندێ بابەتی جوزئی عیبادەتو عەقیدەو هەڵسوکەوتدا .

جەختو تەئکیدکردن لەسەر زەقکردنەوەو جێبەجێکردنی هەندێك ئادابو سوننەت لە نوێژو بەرومەجلیسو بەرگو پۆشاكو ...هتدا کە بەدرێژایی مێژوو لەنێو زانایاندا کێشەو مشتومڕیان لەسەر بووەو جێگای جیاوازی(خلاف) بوون، وەك پەنجە جووڵاندنی بەردەوام لە تەحیاتداو؛ دەست زۆر بەرزگرتن لەکاتی ڕاوەستانداو، لاق زۆر لێككردنەوەو، ڕیش زۆر درێژگردنو دەلینگ هەڵپێچانو لەبەر کەس هەڵنەستان لەمەجلیسداو ...هتد .

کە دیارە بەگوێرەی بنچینەکانی شەرع(قواعد الشرع) ئەگەر گریمان هەندێك لەو هەڵسوکەوتانە بەس ئەو بارەشیان سوننەتو شەرعیبێ کە ئەو برایانە خوویان پێوەگرتووە، مادەم پابەندی بەو ئادابو سوننەتانەوە ببێتە هۆی چواندنی شتێکی فەرز وەك یەکریزیو تەبایی مسوڵمانان یان پەیداکردنی شتێکی حەڕام وەك نامۆییو سڵەمینەوەی خەڵكو بەدگومانی پەیداکردنیانو بڵاوبوونەوەی دڵەڕاوکێو بەلبەلەی فیکری لەنێوانیاندا، ئەوە بێگومان دەبێ دەسبەجێ سوننەت بەقوربانی فەرز بکرێو شتی گچکە لەپێناوی ئی گەورەتردا فەراموش بکرێ، ئەگەرنا خاوەنەکەی لەسەری فەرزار دەبێتەوەو دەبێتە سەپانی پووشێ، چونکە لەدینداری کردەوەدا ئیخلاص چەندە بەمەرج گیراوە پێکان(اصابة)و لێزانیش هێندە، ئینجا شایانی باسیشە کە پێکانو حیکمەتو لێزانی تەنیاوتەنیا بەشوێنپێهەڵگرتن(اتباع)ی پێغەمبەر(صلی‌اللەعلیەوسلم) مەیسەردەبێ، جا بابزانین پێغەمبەری پێشەوامان لەو جۆرە حاڵەتانەدا چڕەنگێکی بۆ ڕشتووینو چۆنی فێرکردووین:

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە عائیشە خوای‌لێ‌ڕازی‌بێ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا(صلی‌اللەعلیەوسلم) پێی گوتم: ئەی

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

عائیشە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەگەلەکەت لەسەردەمی کوفرەوە نزیکن، ئەوا دیواری کەعبەم دەگێڕایەوە سەر بناغەی ئیبراهیم !!

وەك دەبینن پێغەمبەری کارزان(صلى‌اللهعليه‌وسلم) لەبەر مەترسی پەیدابوونی گومانو دوودڵیو ئیشکالێك لەدڵی خەڵکدا چاوپۆشی کردووە لەڕاستکردنەوەو هێنانەوە جێگای‌خۆی دیواری قیبلەی ئوممەتەکەی چونکە دیارە زانیویەتی کە خێروچاکەی ئەو دیوار گواستنەوەیە هەرچەندە زۆریش گرنگە، هێندەی مەترسی شەڕو خراپەیەك نابێ کە وێدەچێ لەئەنجامێ ئەوەوە پەیدابێ !!

دەجا بێگومان پەنجە جوولاندنو دەست زۆر لەپشت سینگەوە گرتنو لەبەر خەڵك هەڵنەستانو ...هتد لەدیواری قیبلە ڕاستکردنەوە هەرچۆنبێ گرنگترنینو پەیدابوونی دڵەڕاوکەو بەلبەلەی فیکریو سلەمینەوەو بەدبینیو بێمتمانەییو زەمو غەیبەتیش لەمەترسی پەیدابوونی ئەو گومانو ئیشکالەی ئەوسا هەر کەمتر نین !

ئەمانە دوو نموونە بوون بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەهەڵەداچوون لە ناسینی ئیسلامدا بەهۆی پەنانەبردنە بەر قورئانو سوننەت وەك دوو تاقە سەرچاوەی ڕوونی ئیسلام، ئینجا با وێنەیەکیش بێنینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی خلیسکانی ئینسان لەکارکردندا بۆ ئیسلام بەهۆی نەشارەزایی بەواقیعی ئەو کۆمەڵگاو دەوروبەرەی کە کارەکەی تێدا ئەنجام دەدرێ.

لەمێژ ساڵە لە کوردستاندا -زۆربەی بەشەکانی- برایانێك هەن کە هەوڵوتەقەلای ئەوەیانە ئیسلام ببووژێننەوەو حوکمی ئیسلام بێننە کایەوە، بەڵام ئێستاشی لەگەڵبێ نەك هەر بەو مرادە نەگەیشتوونو ئەو مەقسوودەیان حاصل‌نەبووە، بگەرە لەقەدەرو تەمەنی درێژی کاکردنیان لەچاو حیزبە لائیکەکانی دەوروپەرێزیکی ئەوتۆشیان دیار



www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

نی‌یه كه له‌ئیسلام بوه‌شێته‌وه‌و له‌ئاستی پێویست دابێت(١) ! جا به‌نده پێی وایه كه هه‌رچه‌نده كه‌لێن‌و ناته‌واوی له‌نه‌خشه‌و به‌رنامه‌ی كاری ئه‌و برایانه‌دا هه‌یه -به‌تایبه‌تی له‌م دوایی‌یه‌دا ئه‌و كه‌لێن‌و ناته‌واوی‌یه زلترو زه‌قتر بۆته‌وه- به‌لام هۆكاری سه‌ره‌كی‌ترو بنه‌ڕه‌تی‌تری خلیسكان‌و هیچی‌وا پێ‌نه‌كرانی ئه‌و برایانه له‌گۆڕه‌پانی كوردستاندا ئه‌وه‌یه كه وه‌ك پێویست به‌بارودۆخی كوردستان ئاشنانه‌بوون‌و نه‌یانتوانیوه وه‌ك پێویست ده‌ركی ئێش‌وژان‌و موعاناتی خه‌لكه‌كه بكه‌ن‌و به‌پێی عه‌قلی‌وان قسه‌بكه‌ن‌و گرێ‌كوێره‌كانی دلیان بكه‌نه‌وه‌و ئیقناعیان‌بكه‌ن به‌وه‌ی كه ئیسلام ده‌توانێ سه‌رفرازو به‌خته‌وه‌ریان بكات‌و باری كه‌وتوویان ڕاست بكاته‌وه‌و حه‌زیای زولم‌و چه‌وساندنه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌یی‌یان له‌كۆل‌بكاته‌وه . ئه‌مه‌ش زیاتر به‌هۆی ئه‌وه‌وه‌بووه كه ئه‌سلی بیروبۆچوون‌و ئیجتیهادوشێوه كاركردنه‌كه بۆ ئیسلام له واقیعی كوردستان هه‌لنه‌قولیوه‌و له‌شوێنێكی‌تری جیا له‌كوردستانه‌وه هاتووه‌و ئه‌و برایانه‌ش كت‌ومت‌و بێ‌ده‌ستكاری قیاسی كوردستانیان له‌سه‌ر ئه‌و شوێنه كردووه‌و هه‌ولی چه‌سپاندن‌و به‌ڕێوه‌بردنی ئه‌و فیكره‌یان تێكدا نه‌داوه، بێ‌خه‌به‌ر له‌وه‌ی كه(الفتوى يختلف زمانا ومكانا وشخصا)،ئه‌مه له‌لایه‌كه‌وه، له‌لایه‌كی دیكه‌شه‌وه هه‌ر له‌به‌ر چاك‌نه‌ناسینی واقیعی جیای كوردستان‌و ڕه‌چاونه‌كردنی تایبه‌تمه‌ندی‌یه‌كانی، وه‌په‌ند وه‌رنه‌گرتنیش له‌شكست‌و فه‌شه‌ل‌هێنانی ئه‌و شێوه كارو خه‌باته له‌شوێنی ئه‌سلی خۆیشیدا -كه میسره- ئه‌و برایانه له‌جیاتی ئه‌وه‌ی خه‌می هێزوده‌سه‌لات وه‌ده‌ست‌هێنانێك بخۆن، كه له‌سه‌رتاسه‌ری دنیادا به‌گشتی‌و به‌تایبه‌تی كوردستان ئه‌وه‌ی هێزو چه‌ك‌و ده‌سه‌لات‌و توانای نه‌بێ هیچ حیسابێكی بۆ ناكرێ‌و داری بۆ له‌سه‌ر به‌ردی داناندرێ، به‌لێ له‌جیاتی ئه‌وه لێكرا لێكرا بۆ ئه‌ندام‌و

(١) دیاره نالێین هیچیان نه‌كردووه‌و ڕێزو ته‌قدیرمان بۆ كردو كۆشش‌و ته‌قه‌لاشیان هه‌یه .

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

لایەنگرانی خۆیانو جەماوەرێشیان تەئکید کردۆتەوە کە بڕوایان بەهێزو بەکارهێنانی چەکنی‌یە بۆ کاری ئیسلامی‌و بەدیارەیەکی شارستانەنشینی نازانن !! ڕەنگە پێشیان وابووبێ کە بەم جۆرە قسانە ڕێزو حورمەتیان لەنێو خەڵکی‌دا زیاد دەبێ‌و بەپیاوی باشیان لەقەڵەم دەدەن ! بەڵام من لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستی زۆریشم بۆیان پێم‌وایە ئەگەر واقیعی ئەمڕۆی دنیاو کۆنی مێژووو بارودۆخی ئێستای کوردستانیشیان چاك دەرك‌کردباو ناسیبا، نەواشیان دەکردو نەواشیان دەگوت، چونکە ئەمریکا کە خۆیشی‌و خەڵکیش بەلووتکەی شارستانێتی ماددی دەزانێ لەبەر عەقڵ‌و مەنتیق‌و قانوونی‌یە کە کوێخای دنیایە، بەڵکو لەبەر هێزو دەسەڵات‌و چەکی سەرکوت‌کەریەتی‌و لەکوردستانو غەیری کوردستانیشدا هەر هەمان پێوان لەگۆڕڕێ‌دایەو واقیعیش بەئینکاری‌کردنو پینەوپەڕۆ تەئویل کردن یان خۆلێ‌گێل‌کردن ناگۆڕێ !

پاشان بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ڕاستی‌یەکی‌تریش بکەم: ئێمە کە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەهەڵەداچوون لە ناسینی دین‌دا بەهۆی پشت‌نەبەستن بەقورئانو سوننەت وێنەمان بەبرایانی ئەهلی طەریقەت‌و برایانی سەلەفی هێنایەوە، نامەوێ کەس لەم قسانەم ئەوە بفامێنتەوە کە ئێمە پێمان‌وایە صۆفی‌و سەلەفی‌یەکان(١) بەس لەبەر نەبوونی شارەزایی‌و تێگەیشتنی تەواوو فراوانو قووڵ لەقورئانو سوننەتدا لەناسینی ئیسلام‌و جم‌وجۆڵ‌و چالاکیشیان بەهەڵەداچوون، بەڵکو کرچ‌و کاڵی‌و لاوازیان لەم ڕووەوە زەقترە ئەگەرنا کرچ‌و کاڵی‌و ناتەواوی‌یان لەبواری ئاشنایی بەواقیعیش هەرهەیە، ئاخر برایانی صۆفی‌و سەلەفی ئەگەر چاك شارەزاو ئاشنای سیاسەت‌و نەخشەو پیلانی کوفری جیهانی‌و دەست‌وپێوەندە ناوچەیی‌و خۆووڵاتیەکانیان‌بن، ڕێگا

(١) ئەمە وەك حاڵەتی گشتی ئەو دوو تەوژمە، بەڵام لە هەردوو لاشیاندا خەڵکی تێگەیشتووو شارەزاو چاوکراوە هەن ئەگەرچی کەمیشبن.

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

بەخۆیان دەدەن کەخەڵکی مسوڵمانی کوردو غەیری کوردیش بانگ‌بکەن بۆ تەنیاوتەنیا سەرگەرم‌بوون بەزیکرو فیکرو تەزکیە لەلایەک‌و دەم‌بەدەمەو مشتومڕ لەسەر هەندێ لایەنی جوزئی عیبادەت‌و عەقیدەو ئاداب لەلایەکی‌ترەوە .

سەربارەش لەنێوان خۆیاندا بکەونە گێرەوکێشەو یەکتر بوغزاندن‌و لەیەک‌ڕاندن‌و یەکتر بەزەندیق دانان‌و بەموشریک دانان ؟!!

هەروەها کە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەهەڵەداچوون‌و خلیسکانی ئینسان لەکارو چالاکی ئیسلامیدا بەهۆی بێ‌ئاگایی لەواقیع‌و زەمینەی کارەکەی برایانی مسوڵمان(الاخوان المسلمون)مان بەوێنە هێنایەوە، وەنەبێ لە تێگەیشتن(فقه)ی ئەو برایانەش دەربارەی(دین) زۆر ڕازی‌بین !

ئاخر ئەو برا مسوڵمانەی کەخۆی بەشوێن‌کوتووی قورئان‌و سوننەت‌و شارەزاو تێگەیشتوو لەئیسلام دەزانێ، ئایا نابێ بەرلەوەی واقیع ناچاری بکات‌و قەناعەتی پێ‌بگۆڕێ دەقەکانی قورئان‌و سوننەت وا داری‌بکەن کە چۆن‌چۆنی دینداری بکات ؟!

ئایا ئایەتی: «واعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم وآخرين من دونهم لا تعلمونهم الله يعلمهم...» الانفال(٦٠)، وە ئایەتی: «وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ...» البقرة(١٩٠)، وە ئایەتی: «ان الله يحب الذين يقاتلون في سبيله صفا» الصف(٤)، وە ئایا فەرموودەی: «...بعثت بالسيف بين يدي الساعة...» رواه البخاري، وە فەرموودەی: «...نصرت بالرعب مسيرة شهر...» رواه البخاري، وە فەرموودەی: «...وذروة سنامة الجهاد...» رواه الترمذي، وە فەرموودەی: «...واعلموا ان الجنة تحت ظلال السيوف ...» ...

بەڵێ ئایا ئەم ئایەت‌و فەرمایشتانە بۆ کاتێکی دیاری‌کراوو کۆمەڵگایەکی ناشارستانی بوون یان حوکمی هەمیشەیی‌یان هەیە ؟!

www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

# لەکۆتاییدا دەڵێم :

باهەوڵبدەین بەهەرچی توانامان هەیە سەرگەرمی زیاترو چاکتر تێگەیشتنی قورئانو سوننەتبین لەبەر تیشکی بەرهەمو کەلەپووری زانایانو بیرکردنەوەو ئەزموونی ڕۆژگاری خۆشماندا، وە وردو وریابین لەناسینو شارەزابوونی واقیعی ئەمڕۆی جیهان بەگشتیو کۆمەڵگاکەمان بەتایبەتی، وە با جەختو زەخت لەخۆمان بکەین کەقوتارو دەربازبین لەفشارو قورسایی بیروبۆچوونە باوە ناشەرعیەکانی سەردەمو ڕۆژگاری ڕابردووش، وە دڵنیاش‌بین لەوەی کە هەقی موتڵەق تەنهاوتەنها لەقورئانو سوننەتدایەو غەیری ئەوان قسەشی لێوەردەگیرێو بەسەریشی دادەدرێتەوە، وە بابشزانین کە هەرکام لەزاناو پێشەوایانی بەرزو بەڕێزمان بەگوێرەی تواناو ئامادەییو بەپێی پێویستی خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان یاساو حوکمیان لەقورئانو سوننەت هەڵهێنجاوەو ئێمەش دەبێ چاو لەوانبکەینو هەوڵیش بدەین بەچاکترین شێوە لەبەرهەمو کەلەپووری پێشینانمان بەهرەمەندبین، بەڵام وریابین بەهۆی بەس خوێندنەوەی کتێبەکانی ئەبوو حامیدی غەزالی پێمان وانەبێ کە ئیسلام بەس تەصەووفەو زوهدەو بەتەنیا بۆخۆژیانەو، بەهۆی بەرهەمەکانی فەخرەددینی ڕازییەوە واتێنەگەین کە ئیسلام بەس موناقەشەو مشتومڕی فیکریو فەلسەفییەو، بەهۆی خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور(رسائل النور)ی نوڕسیشەوە وانەزانین کەئیسلام بەس ئیمانەو ئیمان !....وەهەروەها .

وە لەهەمان کاتیشدا بەچاوی ڕێزو حورمەتەوە تەماشای زاناو پێشەوایانی خۆمانو بەرهەمەکانیان بکەینو پێمان وانەبێ کە هەر ئەو بەشە لەئیسلام حاڵیبوون کە لەکتێبەکانیاندا بۆ ئێمەیان باس‌کردووە، بەڵکو عوزریان بۆ بهێنینەوەو بڵێین: هەروەك چۆن



www.alibapir.net

www.youtube.com/alibapir١

پزیشکێکی حەکیمو دڵسۆز لەسەدان جۆرە دەرمانو چارەسەر کە لەبەر دەستیدان تەنها جۆرێك بۆ نەخۆشەکەی بەردەمی دیاریدەکاتو وەسفدەکات، زاناو پێشەوایانی ئێمەش لەدەرمانگای شەریعەتدا هەرکەسە بەپێی پێداویستی خەڵکی ڕۆژگاری خۆی دەرمانو چارەسەرێکی باسکردووەو خستوتەڕوو، بەڵام بەڕای بەندە لەنێو زانایاندا هیچ کەس هێندەی (ابن تیمیة)و لەنێو عاریفانیشدا هیچکەس بەقەدەر(سید احمد السرهندي) ناسراو بە(الامام الرباني) ئیسلامیان بەفراوانیو هەمەلایەنی طەرحنەکردووەو بەکردەوەش پیادەنەکردووە . لەزاناو پێشەوایانی پێشینمان(١)و لەوانەی هاوچەرخو تازەش شەهیدان(حسن البنا)و(سید قطب)و(مودودي)ی ڕەحمەتی پەرێزو شوێنەواریان لەم بوارەوە لەخەڵکیتر بەرچاوترو ئاشکراترە، خوای میهرەبان بەچاکترین شێوە پاداشتی هەموو لایەکیان بداتەوەو ئێمەش سەرکەوتوو بکات لەشوێنپێ هەڵگرتنو چاولێکردنو بەهرە لێوەرگرتنیاندا .

● ● ●

---

(١) دیارە ئەم مەدحە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم دوو بەڕێزەش بێهەڵەوپەڵەنو هەرچی گوتوویانە ڕاستەو بەچاونوقاندنەوە وەردەگیرێ !!



www.alibapir.net

